کتێبخانەی تویشوو

زنجیرەی گەنجانی ئیسلام 58

# 10
# شەوی کۆتای مانگی ڕەمەزانی پیرۆز

وتاری:
م.اسماعیل سوسەیی

نوسینەوەی:
احـــمـــد

1445هـ

## بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَسْتَهْدِية وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ، يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَ اتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ، يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا  يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ،

أَمَّا بَعْدُ

فإنَّ أصدق الحديث كلامُ الله، وخيرَ الهدي هديُ محمَّدٍ صلَّى الله عليه وسلَّم، وشرَّ الأمور محدثاتها، وكلَّ محدثة بدعة، وكلَّ بدعة ضلالة، وكلَّ ضلالة في النار.

ثم أَمَّا بَعْدُ ،

اللَهُمَ الطَّهِر قُلُبَنَا مِنَ الشُّبُهَاتِ وَالشَّهَوَاتْ وَأَعْمَالَنَا مِنَ الرِّيَاءْ (آمين).

مووسڵمانانی بەڕێز و سەنگین خۆشحاڵ و بەختەوەرین پێتان دەگەیـــنـەوە بـــۆ پێشکەش کردنی باس و بابەتێکی یەکجار گرینگ لە ژیانی مرۆڤی بڕواداری موەحید کە

پێویستە زۆر سەرنجی بدات و خۆی بۆ ئامادە بکاتن لە دەستی نەچێت ، چونکە بەڕاستی ئەوکاتەیە کە قیامەتی تەواو پێوە دایین دەبێت و زەخیرە و توێشوویەکی زۆری تێدا کۆدەکرێتەوە ئەگەر کەسێک دانا و زیرەک بێ و تێیدا تەمبەڵ نەبێ ، باس و بابەتەکەمان وا تەواو لێی نزیک بووینەوە لەوکات و ساتەی کەوا خودای پەروەردگار بە ڕەحم و بەخششی خۆی بەخشیوویەتی بە ئوممەتی پێغەمبەری (ﷺ) کەوا مانگی ڕەمەزان خۆی لە خۆیدا بەخششێکی خودایيە جا لەنێو مانگی ڕەمەزان چەندین بەخششی تری تایبەتمەند تر هەیە کە دەمانەوێ باسی دوو لەو بەخشیشە تابەتەی بکەین کە لەناو یەکدان و تێکهەڵکێش کراون لەلای خودای گەورە ، ئەویش دە شەوەکەی کۆتایی ڕەمەزان و (لیلة القدر )ە کە شەوێکە لە هەموو شەوەکان گرینگرترە کە مرۆڤی موسڵمان دەبێ چاوەڕوانی بێت و دەبێت هەوڵی ئەوە بدات ئەگەر پێی گەیشت بەکاری بێنێ لەپێناو خودای پەروەردگار زاد و زەخیرە و توێشوویەکی زۆری تێدا کۆبکاتەوە و لەدەست خۆی نەدات ، ئەو دە شەوانە بەڕێزان لە دەست خۆتانی مەدەن دوعای تێدا بکەن کە رب العالمین بەنسیبی هەر هەموومان بکاتن و بمانگەیەنەتە ئەو دە شەوەی ، جا پێویستە لە ئێستاوە ئامادەکاری بۆ بکەین بە ڕێک و پێکی نەک بە بیر و عەقڵی خۆمانەوە وەکو خەڵکێکی وا دەزانن ئەگەر نیەتی باش بوو هەر ئیش و کارێکی ئەنجام بدات ئەگەر چاکیش بوو خودا (ﷻ) وەری دەگرێ نا نەخێر عیبادەتەکان وا نیە دەبێ لەسەر نەخشە ڕێگای خودای پەروەردگار بێ ئەگەرنا ڕەتکراوەدەبێ لای خودای گەورە و وەرناگیرێ ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ :

«مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ»[1] واتە هەریەکێ شتێکی دابنێت و بەدی بهێنێ لە ئاین و دین و ڕێبازەکەم و تێیدا نەبێ ئەوا ڕەت کراوەیە بەسەریدا ، کەواتە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) چی کردووە بۆ خۆی لەو دە شەوەدا ئێمەش دەبێ ئەوانەی لێ وەربگرین و لێیەوە فێرببین ، ئەو دە شەوە دەشەوێکی یەکجار گرینگ و پلەدارن وەک چۆن دایە عائیشە و هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی چەندین باس و خواسیان لە پێغەمبەریەوە (ﷺ) گێڕاویتەوە ، ئەوەتا یەکێ لە فەرموودەکان دەڵێ : « كَانَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ شَدَّ مِئْزَرَهُ، وَأَحْيَا لَيْلَهُ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ »[2] واتە : هەرکاتێ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ئەو دە شەوەی بەسەردا بهاتایە (کە زۆر گرینگ بوو بە لایەوە جێگای ئەوەبوو کە زۆر عیبادەت و پەرستشی زۆری تێدا بکات و توێشووی زۆر کۆبکاتەوە ) خۆی دەپێچایەوە ( خۆی توووند دەکرد و خۆی هەڵدەکرد لێی کە زانیان لەبارەی (شَدَّ مِئْزَرَهُ) دەفەرموون واتە (اعتزال النساء) یانی وازی دەهێنا لە هاوسەرەکانی و سەرجێی کردن لەگەڵیان و کۆبوونەوە لەگەڵیان وەکو شەو و ڕۆژەکانی تر لەگەڵ خێزانەکانی وەک لە پێغەمبەر دەوەشێتەوە(ﷺ) ، وە هەندێکی تریش دەڵێن واتە(شمر للعبادة) یانی خۆی

---

[1] أخرجه البخاري (٢٦٩٧)، ومسلم (١٧١٨).

[2] صحيح البخاري (٢٠٢٤).

گوورج و گۆڵتر دەکرد بۆ زیاتر کردنی عیبادەت و پەرستشەکان وە زانایان دەڵێن هەردوو ماناکە دەگرێتەوە واتە هەم خۆی گوورج و گۆڵ دەکرد بۆ عیبادەت و پەرستشەکان زیاتری ئەنجام دەدا وە لەهەمان کات دووردەکەوتەوە لە خێزانەکانی و سەرجێی کردن لەگەڵیان ) ،

## سەرپێچیەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لەو دە شەوەدا وەک ئێمە عیبادەتی ئەنجام نەدەدا چونکە ئێستاکە لە سەردەمی ئێمەدا دە شەوەکە زیندوو دەکرێتەوە و ماندوو بونێکی زۆر دەکەن بەڵام لە لای خودای پەروەردگار (ﷻ) وەرگیراو نیە ووەرناگیرێ چونکە ئەوئیش وکارانەی دەیکەن موافقی قورئان و سووننەتی پێغەمبەر نیە (ﷺ) ، وەکو ئیمامی شاطبی فەرموویەتی : کەوا کاتێ بە یەکێ دەڵێی ئەوە مەکە بیدعەیە بۆنموونە بیدعەی صەلاوات دەکات دەشڵێ خۆ صەلەوات لێدان لەسەر پێغەمبەری (ﷺ) شەڕە؟ خراپە؟ جا ئیمامی شاطبی لە وەڵامی ئەو جۆرە بیدعەچیانە دەفەرمووێ : ئەو کەسانەی بە حیسابی خۆیان کارێکی خەیر دەکەن بەڵام بیدعەیە کە دەیکەن خۆ خوودی کارەکە چاکە بەڵام شێوازەکەیی وکاتەکەی بیدعەیە و داهێنراوە پێچەوانەیە لەگەڵ سووننەت و ڕێبازی پێغەمبەری (ﷺ) نە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی کردوویەتی نە هاوەڵەکانیشی وایان نەکردووە جا ئەوەی بیدعەکەی دەکات لە نە زاناترە لە

پێغەمبەری (ﷺ)پەنا بەخوای نە لە هاوەڵانیش دڵسۆزترە لە ئەنجام دانی عیبادەت وپەرستشەكان چونكە ئەوەی ئەوان كردوویانە لە جێترە وڕاسترە لەبەرئەوەی ئەوان ڕاستەوخۆ پێغەمبەریان بینیە (ﷺ) و نەیاندەهێشت هیچ خێرێكیان لە دەست بچێت و ئەو گوناهانەی ئێمە ئەمڕۆ دەیكەین ئەوان بە گوناهی گەورەیان دانابوو لەسەر خۆیان ئەوها لەخودا ترس بوون و نزیک بوون لە خودای پەروەردگار و پەیڕەوی سووننەتی پێغەمبەریان دەكرد (ﷺ) ، ئەوەی ئێستاكە دەكرێ لەو سەردەمەدا و لە زۆربەی وڵاتان لە دە شەوەكەدا ئەوە زیندوو كردنەوەی شەوەكان نیە و خۆ گوورج و گۆڵ كردن نیە بۆ پەرستش و عیبادەت و خوێندنەوەی قورئان و مانەوە لە مزگەوتەكان و (الإعتكاف) كردن بەڵكو شەو زیندوو كردنەوەیە بە خواردن و خواردنەوە و چەرەزات و قسەی بێ مانا و پڕووپووچ غەیبەت كردن و كات بەفیڕۆ دان و یا نووستن ئەوانە هیچیان لەگەڵ ڕێبازەكەی پێغەمبەر (ﷺ) یەک ناگرێتەوە یان هەندێكیان (صلاة التسبیح) دەكەن بە جەماعەت ڕاستە خیلاف و جیاوازی هەیە لەناو زانایاندا هەندێكیان پێیان وایە سووننەتە بكرێت و فەرموودەكە بە ڕاست دادەنێن و قەبوڵی دەكەن هەندێكیشیان ڕەتی دەكەنەوە دەڵێن لاوازە ئەوەی ڕاستە دەبێ هەریەكەو بە تاک بۆخۆی بیكات ، یا زۆرجارلە مزگەوتەكان ئاهەنگ دەگێڕدرێت وا دەزانن كە شەو زیندوو كردنەوەیە بەوەی كەوا هەندێكیان سروودی دەڵێن هەندێكیان (دُفْ) دەفی لێدەدەن پەنا بەخودای كە كارێكی زۆر ناپەسندە دەف لێدان لەناو مزگەوت و ماڵی خودای و هەندێكی وتاری دەدات و هەندێكی پرسیار دەكات

ئا ئەوانە هیچیان ڕیوایەت نەکراوە لە پێغەمبەریەوە (ﷺ)بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) خۆی گووج و گۆڵ دەکرد بۆ کردنی ئەو عیبادەتانە :

١ – **الإعتكاف کردن** : دایە عائیشە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێت : « كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ » [1] واتە : پێغەمبەر (ﷺ) ئیعتیکافی دەکرد و(دەماوە) لە مزگەوت لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان ، (إعتكاف) واتە : بەنیەتی کردنی عیبادەت وپەرستش مانەوە لە مزگەوت یا لە شوێنێکی دیاریکراو ( لە وتارێکی تر بۆتان باس دەکەیــن إن شاء الله ) کە لەسەر ڕای زانایان ئەگەر لە مرگەوتیش نەبێ لە شوێنێکی تری دیاریکراو بێت دەبێ بە مەبەستی عیبادەت و پەرستشی خودای گەورە (ﷻ) ، (لە وتارەکەی باسی دەکەین إن شاء الله ) ، جا پێویستە لەسەر مووسڵمان بەرنامەیەک بۆخۆی دابنێت لەو دە شەوەدا کە لەپاش نوێژی عیشاوە دەست پێبکەی تا نوێژی بەیانی جا لەو نێوانە تەڕاویحەکان بکەیت باشە وە نوێژی تریش بکەیت جگەلە تەڕاویح و درێژی بکەیتەوە زیاتر لە ١١ ڕکاعەتەکەی ئەوا درووستە .

٢ – **دوعا کردن** : وە لەو نێوانە دوعا بکەی کە خودا لێت خۆش ببێت و لەسەر تەوحید و خودا بەیەک گرتن بتژیەنێ و بتمرێنێ و دوورت بخاتەوە لە شیرک و هاوبەشی

[1] أخرجه البخاري (٢٠٢٦) ومسلم (١١٧٢).

و بتپارێزێ وە دوعا بکەیت بۆ هەموو موسڵمانان لە هەرشوێنێک بن کە بێ وەزعن و لە تەنگەشە و ناخۆشیەک دان وە ئەوانەشی کە گیراون بە دەستی زاڵم و طاغوت و کافرەکان وە ئەوانەشی کە هەرئازارو ئەشکەنجەیەک و ئەزیەتێک دەدرێن بەدەستی کافرو موشریک و دوژمنانی ئیسلام دوعای خەیریان بۆ بکەی و وە دوعای سەرکەوتن بۆ تێکڕای موسڵمانان بکەی بەوەی خودا بەردەوامی و ئیستقامەیان پێ ببەخشێ .

٣ - **قورئان خوێندن** * : ئەو دە شەوەی کە زیندووی دەکەیەوە هەوڵبدە قورئان زۆر بخوێنی و تەدەبوڕی تێدا بکەی و لە مانا و مەبەستەکانی بگەی و کارت تێبکات و تێکەڵی بی و مافی تەواوی خۆی بدەییەی کە کەلامی (رب العالمين)ـە (ﷻ) .

٤ – **زیکرکردن** : زیکرکردن و یادی خودای گەورە بکەیت ، و ئەو شتانەش بکەیت کە سوود و قازانجت پێ دەگەیەنێت وەک نوێژو قورئان خوێندن و دوعا کردن و زیکر کردن و ئەگەرقسەیەکی خێریش بکەیت یان پرسیاریان لێ کردیت وەڵامیان بدەیتەوە بە مەرجێک بە کۆمەڵ دانەنیشن بەڵکو تاک تاک ئەو شەوانە زیندوو بکرێتەوە خۆ ئەگەرکۆمەڵیش بوون ناوە ناوە لە یەکتری جیا ببنەوە و عیبادەتی خودای گەورە بکەن بە تەنیا لە نێوان خۆی و خودادا ، جا پێغەمبەر (ﷺ) شەوەکانی وا زیندوو کردۆتەوە نەوەک ببێتە شەوی خواردن و خواردنەوە و قسە و قسەڵۆک و نووستن و غەیبەت و غەیبەت کاری (پەنا بەخودای گەورە).

---

*لەناميلكەی : (لە پێشوازی مانگی ڕەمەزان)ـدا بە درێژی باسی گەورەیی و فەزڵی قورئان خوێندنمان کردووە .

## ليلة القدر:

بەڕێزان لەو دە شەوەدا شەوێکی زۆر بە نرخ و بە قیمەتی تێدایە کە ناوەکەی بەخۆیەوە وەیە ناوی (ليلة القدر)ـە واتە شەوی بەڕێزو شکۆدار لەلای خودای پەروەردگار ، هەندێ لە زانایان دەفەرموون بۆیە ئەو ناوەی بەخۆیەوە هەڵگرتووە چونکە شەوێکی پڕلە خێرو بەرەکەت و بە پیتە و خودای گەورە لەو شەوەدا زیاتر پێت و بەرەکەتی خۆی دەخاتە سەرزەوی بۆ بڕوادارو موسڵمانەکان وەک خودای گەورە (ﷻ)دەفەرمووێت : ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١﴾ [1] کەوا قورئانی پیرۆزی تێدا دابەزیوە لە (لوح المحفوض)ـەوە بۆ ئاسمانی یەکەم جا لەوێشەوە بەش بەش دابەزیوە بەسەر پێغەمبەری خودادا (ﷺ)، جا لەو دە شەوەی ئاخیردا لە شەوێکیان قورئانی تێدا دابەزیوە ڕای پەسەند وڕاجع وایە ، ﴿لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣﴾ [2] ئەو لەیلەتو قەدرە خێرو پیت و بەرەکەت تێیدا کە کارێکی چاکە ئەنجام بدەیت چاکترە لە هەزار مانگی کەوا خێروپیت و بەرەکەتیەک و چاکیەکەی کە کارێکی چاکت ئەنجام دابێت ، هەندێکی تر دەڵێن بۆیە ناوی لێنراوە (ليلة القدر) چونکە لەو شەوەدا ئەندازە و تەقدیری ڕزق وڕۆزی خەڵکەکەی دیاری دەکرێت لەگەڵ تەمەن و ئەجەلیشدا کەئەوە قەولی هەندێ لە زانایانی ئەهلی سووننە و جەماعەتە کە خودای گەورە (ﷻ)

---

[1] سورة القدر– آية ١

[2] سورة القدر– آية ٣

دەفەرمووێت : ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾﴾ [١] واتە : لەو شەوەدا هەرکارو فەرمانێکی یەکلایی کەرەوەی خودای گەورە (ﷻ) کارلەجێییکەی فەرمانی تێدا دەدرێت بۆ مەردم و بەدیهێنراوەکان وە ڕزق و ڕۆزی و ئەجەل و تەمەنیان .

## دیاریکردنی لیلة القدر:

بەڕێزان بەڵگەی ئەوەی کە لیلة القدرلە دە شەوەکەی کۆتایە فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە عبداللهی کوڕی عومەر ( رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ) دەفەرمووێت : « أَنَّ رِجَالاً، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم أُرُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْمَنَامِ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم " أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيَهَا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ» [٢] واتە : هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) خەونیان بینی بینیان کەوا لەیلەتوو القدر لە حەوت شەوەکەی کۆتایی مانگی ڕەمەزانە (خەونەکەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە (ﷺ) و فەرمووی : وای دەبینم خەونەکانتان یەکتری گرتەوە و خەونی هەمووتان لەسەر یەک شت کۆبوویتەوە ئەویش حەوت شەوەکەی کۆتایی مانگی ڕەمەزانە (لەیلەتو القدرلەوێ بێ) جا ئێوەش کۆشش بکەن و لەوێ لەیلەتو القدری بدۆزنەوە ، لەو حەدیثەدا زانایان دەفەرموون:ناوی ئەو کەسانە دیاری نەکراوە کە خەونەکەیان بینووە تەنها وتراوە

---

[١] سورة الدخان – آية ٤.

[٢] صحيح البخاري (٢٠١٥) ومسلم (١١٦٥).

هاوەڵان ، جا دایە عائیشەش دەگێڕتەوە ( رَضِيَ اللهُ عَنْها ) دەفەرمووێت : « تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِفِي الْوِتْرِمِنَ الْعَشْرِالأَوَاخِرِمِنْ رَمَضَانَ » [1] واتە : لە دە شەوە تاکەکەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان ئێوە کۆشش بکەن بۆ بیننەوە و بەدەست هێنانی لەیلەتو القدر ، وە ئەبوسەعیدی خودری ( رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێت : « أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم كَانَ يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِالأَوْسَطِ مِنْ رَمَضَانَ، فَاعْتَكَفَ عَامًا حَتَّى إِذَا كَانَ لَيْلَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَهِيَ اللَّيْلَةُ الَّتِي يَخْرُجُ مِنْ صَبِيحَتِهَا مِنِ اعْتِكَافِهِ قَالَ " مَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعِي فَلْيَعْتَكِفِ الْعَشْرَالأَوَاخِرَ، وَقَدْ أُرِيتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، وَقَدْ رَأَيْتُنِي أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ مِنْ صَبِيحَتِهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِالأَوَاخِرِ، وَالْتَمِسُوهَا فِي كُلِّ وِتْرٍ» [2] واتە : پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لە دە ڕۆژە ناوەڕاستەکەی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد ساڵێکی وا ئیعتیکافی کرد و لە مزگەوت مایەوە بۆ عیبادەت و پەرستش هەتا لە شەوەی (٢١)ـەمین دەرچوو لە ئیعتیکافەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بەرەبەیانیەکەی ڕۆژی (٢١)ـەمین فەرمووی : ئەی هاوەڵانم ئەوەی لەگەڵ من ئیعتیکافی کرد با ئەوجارە ئیعتیکاف بکات لە دەی کۆتایی ڕەمەزانێ (واتە لە دەی ناوەڕاست نەیکاتن) من شەوی لەیلەتو القدرم پێ نیشاندراوە بەڵام لەبیرم چۆتەوە جا پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بەیانەکەی لەناو قوڕ و ئاو لیتەدا سەجدەی برد (واتە ئەوشەوی دیارە باران بووە) فەرمووی : لە دەشەوەکەی کۆتایی لەیلەتو القدری بەدەست بهێێنن و لێی بگەڕێن وە لە شەوە

---

[1] صحيح البخاري (٢٠١٧) ومسلم (١١٦٩).

[2] صحيح البخارى (٢٠٢٧) ومسلم(١١٦٧).

تاکەکاندا هەوڵبدەن بەدەستی بێنن ،جا خۆشەویستان ئێمە ئەوەمان بۆ بەدیارکەوت کە لە دە شەوەکەی کۆتایی و وە لە دە شەوەکەش شەوە تاکەکان هەوڵبدەین لەدەستمان نەچێ وە لە پاشانەکە لە حەوت شەوەکەی ئاخیردا زیاتر پێدا بگرین ، هەرچەندە زانایان زۆر لەسەری ڕۆیشتوونە وەک لە (فتح الباري)دا ئیبن و حەجەر زۆر لەسەری ڕۆیشتووە و قەولی زانایانی هێناوەتەوە بەڵام کورتە پووختەی قسان ئەوەیە کە بەئێوەی بەڕێز ڕابگەیەنین ئەگەر دەتەوێ تەواو لەیلەتو القدرت بەنسیب بێت شەوە تاک و جووتەکان هەڵبستەوە چونکە هەندێ لە مەذهەبی شافعی دەڵێن شەوی (٢١)ە ئەوەی پەسەند دەکەن هەندێ دەڵێن (٢٣) هەندێ دەڵێن (٢٥) هەندێ دەلێن (٢٧) و هەندێکیش دەلێن (٢٩) جا ڕاو بۆچونی زانایان دەڵێن لەوانەیە ئەوەش بگۆڕدرێت لە ساڵێک بۆ ساڵێکی تر بەڵام شەوە تاکەکان لە پێشترە وە ئەگەرلە شەوە جووتەکانیش هەڵستایەوە و زیندووت کردەوە لەگەڵ دە شەوەکەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان ئەوا بە دڵنیاییەوە لەیلەتو القدرت بەنسیب دەبێت ئەوەی لەسەرت دەمێنێتەوە ئەوەیە نیەتی خۆت پاک بکەیەوە و ئیخلاصت هەبێ بەڵکو ئەوکاتی عیبادەت وپەرستشەکانت مو افق وهاوڕای سوونەتی پێغەمبەردەبێ(ﷺ) ولەیلەتو القدرت لەدەست ناچێت ، هەرچەندە زانایان زیاتر پێداگری لەسەر شەوی (٢٧) دەکەن بەڵام ئەوەی بۆی کرا با هەموو دە شەوەکەی کۆتایی زیندوو بکاتەوە بە تاک و بەجووتەکانەوە ئەوەی بۆی نەکرا با بەس تاکەکان زیندوو بکاتەوە وە ئەوەشی پێی نەکرا با حەوت شەوەکەی کۆتایی لەدەست خۆی نەدا بە تاک و جووتەوە ئەگەرنا

بەس با تاکەکان زیندوو بکاتەوە وە ئەوەی ئەوانەشی هیچی پێنەکرا با شەوی (٢٧) لەدەست خۆی نەدات بە ئوومێدی ئەوەی کە لەیلەتوو القدربێت ولەدەستی نەچێت

هەندێ لە زانایانی سلف صالح (پێشینانی چاک) دەفەرموون لە ئەگەری بەدیارکەوتنی لەیلەتو القدر هەندێ نیشانە بەدیار دەکەوێ کە لەیلەتو القدری پێ دەناسیەوە :

١ – نور و ڕووناکیەکی تەواو ئەو شەوی پێ دادەپۆشێ .

٢ – دڵ ئارامی و moorتاحیەک بۆ ئیمانداره ڕاستەقینەکان دێتن کە لە شەوانی تردا نەبووه.

٣ – کزه بایەکی ڕێک و پێکی خۆش دێتن بەبێ ئەوەی دڵت پێی تەنگ بێت کە سەکینەت وئارامی لەگەڵدایە .

٤ – تام و چێژێکی زیاتر لە عیبادەتەکان دەبینرێ ئەگەر کەسەکە موسڵمانێکی موخلیص بێ ، ئەو چوار خاڵە لەیلەتو القدری پێ دەناسرێتەوە .

## بۆچی الیلة القدروا شاراوەیە ؟

زانایان فەرموویانە حیکمەت لەوەیدایە کە مرۆڤە مووسڵمانەکان خۆیان بەیەک شەوی نەبەستنەوە و بەڵکو هەوڵی ئەوەی بدەن کۆششی و عیبادەتی زۆر بکەن لەهەموو شەوەکان تا زاد و زەخیرەی زیاتر پەیدا بکەن و تەماعگیر بکەن لە هەر دە

شەوەکەی ئەگەر بیانز انیبا کامە شەوە ئەوا هەرئەو شەویان زیندوو دەکردەوە وازیان لەعیبادەت و شەو نوێژ دەهێنا لە شەوەکانی تر لەبەر ئەوەیە زانایان دەفەرموون شاراوەیە ئەو شەوە وەک پێغەمبەر فەرمووی(ﷺ) لەیلەتو القدرم پێ نیشان دراوە بەڵام لەبیرم چۆتەوە ، بەس گرینگ ئەوەیە ئێمە لە دەشەوەکەی کۆتا لە دەست خۆمانی نەدەین و تەمبەڵی لێ نەکەین و چالاک و وریا بین لەپێشمانە دوعای بکەین خودای بەرز بمانگەیەنەتە دە شەوەکەی کۆتا و وە لە دە شەوەکەش شەوی لەیلەتو القدرمان بە نسیب بکات و و نشاط و چالاک و دامەزراومان بکات لەسەرعیبادەت و پەرستشەکان وەک پێغەمبەر بیکەین (ﷺ) وە خۆشمان بە دوور بێخینەوە لە بیدعە و داهێنراوەکان وە بڕۆین لەسەر ڕاستە ڕێگای پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) تاکو لەو ڕۆژەی کە مەیدانی حەشر و حیسابە زەخیرە و توێشوویەکی زۆرمان هەبێ تا پێیوەی ڕزگار بین و ببردرێینە بەهەشت و لە دۆزەخی سووتێنەر دوور بخرێینەوە (آمین).

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله وصحبيه اجمعين**

.

.

.

،

.

.

